پرۆفیسۆری یاریدەدەر
د . وەلی محمود حمد

## دابه زینی ئاستی

# پەروەردە و زانست

## هۆکار و چارەسەر



کـۆیـە 2010

دابەزینی ئاستی

# پەروەردە و زانست

هۆکار و چارەسەر

پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.وەلی محمود حمد

٢٠١٠ – کــۆیە

**لە بڵاوکراوەکانی نووسەر:**

- نامیلکەیەك بەناونیشانی ئەتەکێت
- نووسینی ووتار و بابەت لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ.
- نووسینی ووتار و بابەت لە ڕۆژنامەی تاك.
- نووسینی ووتار و بابەت لە گۆڤاری کەکۆن.
- هەروەها چەندین بابەتی زانستی و پەروەردەیی لە ئۆرگانە جیاجیاکاندا.


دابەزینی ئاستی پەروەردە و زانست

هۆکار و چارەسەر

بابەت: نامیلکە

دیزاین و بەرگ: زەردەشت محەمەد

نووسینی: پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.وەلی محمود حمد

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم

تیراژ: 500 دانە

کـــۆیە – 2010

# ئاستی پەروەردەو زانست

ئەم سەردەمە، دەمی زانستو زانیاری تەکنەلۆجیایە.. پەروەردەو خوێندنیش لە خزمەتی ئەودایە، لەگەڵ پێگەیاندنی مرۆڤی تەندروستو گونجاوو مەدەنی تا لەگەڵ ئەم دونیا نوێ دا رێکەوێو بڕواو بەرهەم دار بێت.

دیارە کرداری پەروەردەو فێرکردنیش وەك هەموو رەوتێکی ژیان لە گۆڕاندایە.. هەڵەو ناگوزاری تێ دەکەوێ بەڵام ئەبێ هەوڵ بدرێ زانستیانەو واقیعیانە بە پێ توانا لەگەڵ وەزعی کۆمەڵگاکە بگونجێ، پێویستیەکانی بۆ دابین بکرێ.

دکتۆر وەلی جگە لە پسپۆڕیەکەی خۆی ماوەیەگی ژیانیشی بە دەرس ووتنەوە خەریك بووە ئیدارەی پەیمانگایەکی گەورەشی بەڕێوە بردووە.

کۆمەڵێ راوبۆچوونی هەیە لە دابەزینی ئاستی پەروەردەو زانست لەبەر گرنگیو هەستیاری بابەتەکە.. سەنتەرەکەمان بە چاکی زانی چاپی بکاتەوەو بڵاوی بکاتەوە.

ئێمەش ماوەیەکی لە ژیانمان مامۆستا بووینو خەریکی پەروەردەو فێرکردن بووین تەنها داوام ئەوەیە بە لاساکردنەوەو توندرەوی پەروەردە نەشێوێنین.. بە زانستی زۆرو گران فێرکردن گەشە ناکات.. چارەیەکی ئەم بەرنامە زۆرو قورسەی قوتابخانەکان بکەن.. هەر بە نمونە کتێبی زانستی چواری سەرەتایی هی ئەم قۆناغەی منداڵانە؟!.. خواتان هەبێت.

خوا چەپارەی هەر کەسێك بدات..بە مەرامی خزمەت دەنوسێ.

**صلاح شێخ شرف**

**بەرپرسی سەنتەری لێکۆڵینەوەو پەخشی کۆیە**

## دەستپێك

لەبەر گرنگی بواری پەروەردە و هەست کردنمان بە دابەزینی ئاستی پەروەردە و زانست لە کوردستان و مەسئولیەتی سەرشانمان وەك شاگردێکی ئەم بوارە. وە پلە و پایە و کاریگەری ماموستا لەسەر تەواوی پرۆسەی پەروەردە و زانست هەڵساین بە نووسین و بڵاوکردنەوەی زنجیرەیەك ووتار و نووسین لە ڕۆژنامەی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ) بە ناونیشانەکانی (مامۆستا، پەروەردە و خوێندن، پێشکەوتن کە لە ژمارە ٥٠١٠ ی ڕۆژی ٢٠٠٩/١٠/٢٨ بڵاوکرایەوە، دواتر لەژێر ناونیشانی دابەزینی ئاستی پەروەردە و زانست (هۆکارەکانی) بە سێ بەشی یەك لەدوای یەك لە ژمارەکانی ٥٠٦٠، ٥٠٧٨، ٥٠٩٥ لە بەروارەکانی ٢٠٠٩/١٢/٢٩ و ٢٠١٠/١/٢٠ و ٢٠١٠/٢/٩) لە کوردستانی نوێ بڵاوکرایەوە کە تیایدا سەرەڕای هۆکارەکانی دابەزینی ئاستی پەروەردە و زانست و چارەسەرەکانی وە بە ووردی دیاریکردنی خرانە ڕوو. وە من لە هەربەشێك لەم سێ بەشە چاوەڕوانی هەڤاڵ و هاوڕێ و هاوپیشەکانی خۆم و خەڵی پسپۆڕ و بەرپرسی بواری پەروەردەم دەکرد کە وەڵامم بدەنەوە بەڵام وام هەست نەکرد ئەم تەوەرە و بەم مەبەستەی کە من خستبوومەڕوو هیچ نووسینێك بنووسرێت ڕەنگە باشیش نەزانم یان نامەوێت هۆکارەکانی ئەم ساردیە بنووسم. چونکە ئەم چوار نووسینەم لەسەر ئەم تەوەرە

لەبەر گرنگی یەکی یەکجار زۆری پەروەردە و زانست و مامۆستا و پێشکەوتنی کوردستان نووسی. بەڵام بەهیوای ئەوەم لە ماوەیەکی کورتی داهاتوو دێمەوە سەر هەمان تەوەر و بۆ قۆناغی خوێندنی باڵا ئاستەنگ و گرفتەکانی دەنووسم.

پ.ی.د.ولی محمود حمد
ڕاگری پەیمانگای تەکنیکی کۆیە
٢٠١٠/٢/١١

# مامۆستا، خوێندن و پەروەردە، پێشکەوتن

لە منالّیەوە خولیای ناوی مامۆستا بووم هەر کە باسی پیاوێکی چاك و زیرەك و خاوێن و شاری و قسەزانیان بکردایە دەیان ووت مامۆستایە زۆر جار بە مەلای دێ یەکەشیان دەووت مامۆستا مەلا (فلان). بە حوکمی ئەوەی دێ یەکەمان لە (١٩٤٨)ەوە خوێندنگای تیابوو هەرکە چاوم بە دونیا هەڵێنا و فکرم کرد حەزم چووە مەکتەب بەڵام باوکم یەکەمجار کە بردمیە بەر خوێندن ساڵی (١٩٦٩) بوو داوای لە مامۆستاکان کرد کە ئەوان گرنگی تەواوم پێ بدەن وە فێرم بکەن ئەگەر پێویستی بە لێدان و تەمێ کردن کرد هیچ دوودڵ نەبن ئێسك و پێست بۆ باوکم و گۆشتیش بۆ ئەوان. سەرەتا زۆر نیگەران بووم بەڵام دواتر وورده وورده ترسم شکا و مەکتەب زۆر شتی پێ بەخشیم وانەکانی ژیان خۆشەویستی وولات پاك و خاوێنی حەزم چووە مامۆستایەتی. دواتر وورده وورده بە پێ پلیکانەکانی گەیشتن بەم پیشە پیرۆزە هەرزەنام تا بتوانم بگەمە چلە پۆپەی ئەم پیشە پیرۆزە ئەم ناوە گەورەیە.

ئێستا پاش (١٨) ساڵ مومارەسەی ئەم پیشە گەورەیە هەست دەکەم ئەستەمە کەسێك بتوانێ هەموو واتاکانی پڕ بە

پێستی مامۆستا هەڵگرێ یاخود بتوانێ بڵێ من بە حەق مامۆستام. هەر بەڕاستی کاتێک مامۆستا لە پۆل لەبەردەم خوێندکارانی ئەوەستێ و وانە و بابەتەکانی بۆیان باس دەکا و شی دەکاتەوە خوێندکاران وادەزانن هەر پرسیارێك لە بابەتەکە و دەرەوەی بابەتەکەش کە بەخەیاڵیان داهات وا باشە ئاڕاستەی مامۆستای بکەن چونکە ئەو دەیزانێ یاخود لە زۆر گۆڤار و پەرتووك خوێندوومەتەوە یاخود لەزۆر هەڤاڵ و بەرپرسم گوێ لێ بووە بەتایبەت ئەو برادەرانەی کە لە دەرەوە دێنەوە بۆ نموونە دەڵێن ئەمریکا بۆیە وا پێشکەوت گرنگی زۆر گەورەی بە مامۆستا دا، دەڵێن یابان بۆیە وا پێشکەوت چونکە مامۆستای (مقدس) کرد واتە گرنگی گەلێکی پێدان. هەمووەمان بیستوومانە و خوێندومانەتەوە( پێغەمبەر (د.خ)) لەکاتی شەڕدا لەگەڵ نەیارەکانی مەرجی ئازادکردنی دانا بۆ هەندێك دیلی شەڕ بەمەرجێك هەریەکێك لە دیلەکان (١٠) منداڵی موسڵمان فێری خوێندەواری بکات واتە ژیانیان دەکڕاوە بەوەی خەڵك فێری خوێندەواری بکەن یاخود بە واتایەکی تر دوژمنەکان ئازاد دەکرێن و دەبن بە دۆست ئەگەر مامۆستا بن.

زۆر جار کە باسی پارە خەرج کردن و بودجە و شت دەکرێت لە حکومەتەوە دەبیستین کەوا بودجەی وەزراەتی پەروەردە و خوێندنی باڵا بودجەیەکی گەورەیە بەڵام ئەگەر ووردتر سەیری ئەم بابەتە بکەین (وا باشە گەورەترین بودجە بۆئەو دوو دەزگایە بێت چونکە بۆ ئایندەی ژیانی هەر کۆمەڵگا و وولاتێك ئەم دوو دەزگایە گەورەتریت بەرهەم هێنی عەقڵ و

تەکنیك و کادری بەتوانا دەبن) واتە ئەم پارەیە بۆ بەرهەمهێنانی عەقڵ و مەعریفە و زانست و تەکنیك دەبێت کە لە ئەنجام دا دەبێتە گەورەترین سەرمایەی بەردەوام و باشترین دەستکەوتی دارایی و خۆش گوزەرانیش لە ئەنجامی پێگەیاندنی باشترین کادیرانی ئەم دوو دەزگایە دەبێت واتە نابێت وەك وەزارەتی نەوت یاخود پیشەسازی ....... هتد سەیر بکرێت کەوا ئەم پارەی لە خوێندن و زانست و پەروەردە خەرج دەکرێت هیچ پارەیەك دەست ناکەوێتەوە بەزوویی بەڵکو وون دەبێت بەلأم لە دەزگا و وەزارەتەکانی تری بەرهەم هێن پارەیەکی کەم خەرج دەکەیت و هەر یەکسەر چاوەڕێ ی پارەی دەستکەوتی، چونکە دەزگاکە دەزگایەکی بەرهەم هێنەرە. گەر بێ ی باسی خەبات و شۆرش بکەیت لە کوردستانی خۆشماندا دەتوانی بێ دوو دڵی بڵێ ی مامۆستایان دەوری کاریگەریان بینیوە لەم خەباتە پڕشکۆیەش هەم وشیارکردنەوە هەم بەشداری خەبات هەم دانەبڕان لە خەڵك و لە شاخ و لادێکان لە ڕۆژە هەرە سەختەکانی ژیان. بیستوومە کاتی خۆی بە مامۆستایان ووتوە ئەفەندی سەر چەور، وایان داناون کە دەست و پێ سپین و لە خەبات و شۆرش ناتوانن بەرگە بگرن و دەست وەشێن بن بەلأم دواتر هەزاران مامۆستای سەرچەور دەوری قارەمانی و شەڕی پێشمەرگانەشیان ئەنجام داوە و بۆ خەڵك و حزبەکانیان سەلماندووە کە لەم بوارەش چەندە بە توانان و گاڵتەیان پێ ناکرێت دەیان نموونەش هەیە کەمن لەم نووسینە ماوەم نی یە ئەم شتانە بنووسم.

نوێترین سەروەری ماموستایانی پەروەردە و خوێندنی باڵا دوای ڕاپەڕینی بەهاری (١٩٩١)ی میللەتەکەمان و ڕاپەڕین دژی زوڵم و ستەم سەرەڕای بەشداری ڕاپەڕین و کۆڕەو لەگەڵ دڵی میللەتەکەمان دوای ئەوەی حکومەتی بەعس بە پیلان ئیدارەی خۆی کێشایەوە و هەرسێ پارێزگای هەولێر و سلێمانی و دهۆکی دایە دەست بەرەی کوردستانی و دواتر پەرلەمانی کوردستان و حکومەتی کوردی دەسەڵاتیان گرتە دەست (حکومەت پێ ی وابوو بەرەی کوردستانی و کورد ناتوانن ئیدارەی وەزعەکە بدەن و خەڵك خۆی داوای گەڕانەوەی ڕژێم دەکات)، خۆشبەختانە وا دەرنەچوو. گەورەترین پاڵپشتی درووست کردن و ڕاگرتنی حکومەتی کوردستان (ماموستایان) بوون چونکە ئەوکات هەزاران ماموستا لە هەموو پەروەردە هەبوو ژمارەیەکی کەمیش لە ماموستایانی زانکۆی سەلاحەدین و هەرسێ پەیمانگای تەکنیکی کە چەند سەد ماموستایەك دەبوون.

دروشمی سەری بەرز بۆ مووچە شۆڕ ناکەین یاخود نەوی ناکەین بووە دروشمی سەرجەم ماموستایانی ئەوکات کە گەورەترین توێژی میللەت بوون جگە لە سەرچاوەی مووچە و کاری ماموستایەتی هیچ داهاتی تریان نەبوو ژیانیش لە سەخت ترین باری ئابووری دەگوزەرا بەڵام بوونە پاڵپشتی تەواوی بەرەی کوردستانی دواتریش حکومەت نزیکی شەش مانگ مووچە وەرنەگیرا مانگ بوو بووە (٤٠ – ٦٠) ڕۆژ ژیان زۆر بە سەختی بەڕێوە دەچوو بەڵام نەك هەر لە میللەت دانەبڕان بەڵکو

پیلانـی حکومـەتی بغـداد فەشـەلی هێنـا و حکومـەتی کـوردی سـەرکەوت. چـونکە بـە ڕاوەسـتانی خوێنـدن و پـەروەردە و خوێنـدنی بـالاّ گـەورەترین زیـان بـە میللـەت و حیزبـەکان و حکومـەت دەکـەوت. بۆیـە پێم وایـە ئەمـە یـەکێك لـە سـەروەری و دەستکەوتە گەورەکانی مامۆستایانی وولاّتەکەم (کوردستانە).

بۆیە دەڵێم حەق وایە حکومەتی هـەرێکی کوردستان کە بە شێوەیەکی سەرەکی لـە هـەردوو حزبی گـەورە پـارتی و یـەکێتی پێکهـاتووە حـالی حـازر کـە شـوکر وەزعـی مـالی و ئـەمنی و ئاوەدانی باشە وەك پاداشتێك سەرجەم مامۆستایانی ئەوکات واتە ساڵی (١٩٩١ – ١٩٩٢) لە پەروەردە و خوێندنی بالاّ بەسەر بکاتەوە وەك ڕێز لێنانێك لەو هەڵوێستە جوامێرانەیە. ئەم بەسەر کردنەوەیـە مـەرج نـی یـە پـارە بێـت بـا دیاریـەك بێـت، بـا نـاو نووسینێك بێت لە دەفتەری سەروەری، با سوپاس و پێزانینێکی تایبـەت و (تقـدیرکراو بێـت ) لـە سـەرۆکایەت حکومەتـەوە ئاڕاستەیان بکرێـت. وە پێشنیاری دووەمـم ئەوەیـە کـە واباشـە مامۆستا لـەڕووی مووچـە و شـوێنی نیشتەجێ بـوون دەبێـت حسابێکی تایبەتی بۆ بکەن چونکە باش بوونی وەزعی مامۆستا واتە پەروەردەکردنی نەوەیەك بە شێوەیەکی ڕاست و درووست واتە زامن کردنـی ئایندەی میللەتەکەمان واتە هەنگاونان بەرەو ئایندەیـەکی ڕوونـاك و ڕووناکتریش لـە ئێستا. چونکە تێبینـی دەکەم ساڵانێکە لە هەر شار و شارۆچکە و گوندێك کە مزگەوتێك دروست دەکرێـت خـانووی بـەڕێز مـەلای مزگەوتەکـەش لەگـەڵ بینـای مزگەوتەکە دروست دەکرێت ناڵێم ئەوە کارێکی خراپە

بەڵکو ئەوەش پێداویستی مزگەوتەکەیە کەچی لەکاتی دروست کردنی خوێندنگاکان ( بەتایبەتی لە لادێ و شوێنە دوورەکان) هیچ حساب بۆ مامۆستای خوێندگاکە یاخود بەڕێوەبەری خوێندنگاکە ناکرێت. کە ئەمەش کارێکی ناڕاستە، سەردانی زۆر گوند و شارۆچکەم کردووە مالی (معاون طبي)یەکە لەگەڵ بنکەی تەندروستی یەکە درەستکراوە وە بەکاری دوای دەوام و فرۆشتنی داو و دەرمان های لایڤ دەژێیت.کەچی مامۆستاکان بەشێکی زۆری مووچەکانی مانگانەیان بە کرێی هاتووچۆ دەدەن. بۆیە واپێویست دەکات کە حکومەتی هەرێمی داهاتوو کابینەی شەشەم چاوخشاندنەوەیەکی تایبەت بە وەزعی مامۆستاوە بکات ئەوەی تا ئێستا خەریکی بوون هەر دامەزراندنی مامۆستا و هەوڵدانی پڕکردنەوەی کەم و کوڕیەکان بووە وە دوای ئەوەی هەڵمەتی دروستکردنی باڵەخانەی خوێندنگاکان تەواو دەبێت کەوا هەست دەکەین کەم و کوڕی زۆری هەیە وە میلاکات پڕدەکرێتەوە بەپێ ی پسپۆڕیەکان ئینجا لەلایەك دەست بکرێت بە مشور خواردن بۆ چاککردنی باری گوزەران و نیشتەجێ بوون و گرنگی پێدان وەك دروست کردنی یانە و باخچەی تایبەت بە مامۆستایان لە شارەکان وە لەلایەکی تر دووبارە چاو بە توانستی مامۆستان دا بخشێنرێتەوە خوولی تایبەت و بەردەوام بکرێتەوە هەندێك لە تاقی کردنەوە دابنرێت بۆئەوەی ناو ناوە لە ئاستی مامۆستایان دڵنیا ببینەوە. وە دەبێت چاو خشاندنەوە بە دامەزرندنی مامۆستایان بکرێتەوە تەنسیق لەگەڵ وەزارەتی خوێندنی باڵا

بکرێت تایبەت بە دەرچووانی کۆلیجەکانی پەروەردە و کۆلیجەکانی بنەڕەت، چونکە من دەپرسم ئەگەر کۆلیجەکانی پەروەردە کە سیستەمی خوێندن تیایدا لەسەر بنەمای ئامادەکردنی (پیداگۆگ) داڕێژراوە واتە (المربی) لەهەر چوار قۆناغەکانی خوێندن وانەکانی (مبادیء التربیة ، علم النفس العام، علم النفس الطفل والمراهق ، طرائق التدریس ، القیاس والتقویم ) دەخوێندرێت لەگەڵ (٤٥) ڕۆژ (تطبیقات) ئەرێ ئایا لەجیاتی ئەو هەموو وانانە ئەو هەموو کاتژمێر خوێندنانە مانگ و نیوێك خوولی شیاندن بەسە بۆ دەرچووانی کۆلیجەکانی تر کە ئەوان خۆیان بڕوانامەکانیان بۆ بواری کارکردنی تر بەدەست هێناوە و سیستەمی خوێندن و پرۆگرامەکان بۆ ئەوە نەبوون ببن بە مامۆستا؟ وابزانم بە دڵنیاییەوە نەخێر.

**تێبینی:**

➢ ئەم بابەتە لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (٥٠١٠)ی ڕۆژی (٢٠٠٩/١٠/٢٨) بڵاوکراوەتەوە.

# دابەزینی ئاستی پەروەردە و خوێندن، هۆکارو چارەسەر

## بەشی یەکەم

هەمووومان چ لە دەزگاکانی خوێندن چ دەزگاکانی ڕۆشنبیری و تا دەگاتە هەندێك دام و دەزگای حكومی و بازاڕ و ..... هتد ڕۆژانە و بەردەوام باس لەوە دەکەین کە ئاستی خوێندن یاخود (زانیاری)یەکانی خوێندکاران دابەزیوە یاخود باس دەکرێت سالأنی پێشوو ئەگەر یەکێك دەرچووی سەرەتایی بوایە دەبووە خاوەن قەڵەم و زانیاری و دەیتوانی کارێك بکات یاخود ئەگەر یەکێك بڕوانامەی (٣)ی ناوەندی هەبوایە ئەوە هیچ کێشەی خوێندن و خوێندەواری نەمابوو بگرە بە کەسێکی خوێندەوار و بەتوانا دادەنرا و دەناسرا بگرە توانای هەبوو کە زۆر کار و فرمان بەڕێوە ببات بەم ئاستی بڕوانامەیەی. وەك هەموومان دەزانین سالأنی زوو دوای (٣) ی ناوەندی، ئامادەیی (٢) دوو ساڵ بوو وە دواتریش کە بوو بە (٣) ساڵ دەرچووانی ئامادەیی توانایەکی بەرچاو و باوەڕپێکراویان هەبوو کە زۆربەیان مامۆستای بەتوانابوون لە بوار و پسپۆریە جیاجیاکان وە خاوەنی بیر و بۆچوون و دەربڕینی خۆیان بوون،

دەیـان تـوانی لـە هـەموو بایـەت و کـۆڕ و کۆبوونـەوە و بۆنـەو مەڕاسـیمەکان خۆیـان بنـوێنن دەیـانتوانی پەخـشانی بـاش و ئاسـت بـەرز بنووسـن وە بـە بڕوانامـەکانیان تـا ڕادەیـەك بـژێوی ژیانیانی مسۆگەر دەکرد و دەکرا پیێ ی بژین.

بـەلاّم سـالاّنێکە نزمـی ئاسـتی (زانیـاری) خوێنـدکاران و نەتوانینی دەربڕین و نووسین بە زەقی هەستی پێ دەکرێت وە زۆر جار ئاگادارین کە لەبەرئەوەی ناتوانرێت کێشەیەکی ئاستی بڕوانامە و ئیمکانیەت باش بکرێت و بەرزبکرێتەوە هەڵدەستین بـە (الغـاء) کردنـی ئـەم جـۆرە خوێنـدن و بڕوانامـە وە درێژکردنەوەی سالاّنی خوێندنەکە وەك ئەوەی (دار المعلمین) کە (۳) سـالّ دوای ناوەنـدی بـوو الغـاء کـرا و کـرا بـە (معهـد اعـداد المعلمـین) ماوەکـەی کـرا بـە (٥) سـالّ دواتـر پـەروەردە وای ڕاگەیانـد کـە خـاوەنی ئـەم بڕوانامەیـە کـە (٥) سـالّ دوای (۳)ی ناوەندیە ئاستیان نزمە و باش نین بۆ مامۆستایەتی بۆیـە ئـەم جۆرە خوێندنەش الغاء کرا و کران بە (پەیمانگای مامۆستایان) کە بوون بە (۲) سالّ دوای ئامادەیی زانستی و وێژەیی. دوای چەند ساڵێك بە بڕیارێکی کۆنفرانسی وەزارەتی پەروەردە ئەم پەیمانگایانـەش (داخـران) و ئـەم جـۆرە بڕوانامەیـەش کۆتـایی پێهـات بـەهۆکاری ئـەوەی وەزراەتـی پـەروەردە و کـۆنفرانس هاتوونەتـە قەناعـەت کـە دەرچـووانی ئـەم جـۆرە پەیمانگایانـەش ئاستیان نزمە و داواکرا کە وەزراەتی خوێندنی بالاّ لەسـەرجەم زانکۆکان (کۆلیژی پەروەردەی بنەڕەت) بکاتەوە بۆ پڕکردنـەوەی ئەم بۆشای یەی کە درووست دەبێت لەکاتی داخستنی سـەرجەم

پەیمانگاکانی پێگەیاندنی مامۆستایان و ساڵانەش ژمارەی خوێندکارانی سەرەتایی زیاتر دەکات و بەردەوام لەزیادبوون دایە. وە ئێستا ئەگەر بەراوردێك بکەین لەنێوان (ژمارەی پەیمانگاکانی پێگەیاندنی مامۆستایانی کە هەبوون لە سەرتاسەری کوردستان لەگەڵ ژمارەی ئەو کۆلیژی پەروەردەی بنەڕەتیانەی کە لە کوردستان هەیە و زۆربوونی ژمارەی خوێندکارانی سەرەتایی) بەراوردێکی لاسەنگ دەردەچێت. وە ئەگەر لەگەڵ دەزگاکانی پەروەردە و یەکەکانی سەرپەرشتیاری قسە بکەیت لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە ساڵانی لەمەوبەر ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە دەرچووانی ئامادەییە پیشەییەکان و پەیمانگا تەکنیکی یەکانمان بە فلتەری خوولی شیاندن کردۆتە مامۆستا (کە بەڕاستی بە بۆچوونی من کارەساتەکە لێرەوە دەستی پێ کردووە چونکە چۆن دەبێت ئەگەر لە سیستەمێکی پەروەردەدا کەسێك بۆماەی (٣) ساڵ یاخود (٢) ساڵ وانەکانی پەروەردەو، دەروونزانی و، هەڵسەنگاندن و... هتد وەربگرێت پێ ی بوترێت (المربی) پێداگۆگ کەچی تۆ بە یەك خوولی (٤٥) ڕۆژی هەتا (٩٠) ڕۆژیش بەپەلە ئەم کەسە بکەیت بە مامۆستا چۆن کاریگەری خراپ و نێگەتیڤی لەسەر تەواوی پرۆسەی خوێندن و پەروەردە و ئاستی خوێندکار نابێت). کە بەڕاستی بەداخەوەم لە دەزگاکانی پەروەردە و یەکەکانی سەرپەرشتیاری کەس بەدواداچوونی لەسەر (Data) و معلومات بۆ نەکردووە. وە خۆی ئەو پرۆسەی (الغاء) کردنی دار المعلین و معهد المعلمین لەلایەك و لەلایەکی تریش بەلێشاو بە خوولی شیاندن خەڵك

کراوەتـە مامۆسـتا (قیادەی) پـەروەردەیی خۆیـان بەرپرسـن و تاوانبـاری یەکـەمن لـەم وەزعـی ئاسـت نزمـی خوێنـدکارانی خوێندنی بنەڕەت واتە سەرەتایی.

ئەوە تـائیرەی بابەتەکـە و باسـەکەی ئیمـە تایبـەت بـوو بـە مامۆستای سەرەتایی واتە خوێندنی (بنەڕەتی) ئێستا، کە دێینە سەر ناوەندی و ئامادەیی پێشوو (پۆلـەکانی ٧ ، ٨ ، ٩ ، ١٠ ، ١١ ، ١٢) ی سیـستەمی نـوێ سـەیر دەکـەین هـەمان بابـەتی خوێندنی سەرەتایی دووبارەبۆتـەوە و کارەسات بارترە. چونکە بۆ ئەم قۆناغەی خوێندنیش کە خوێندکاری ناوەندی لە قۆناغی ناسـکی ژیـانی دایـە قۆنـاغی هـەرزەکاری (فـترة المراهقـة) وە خۆشـــی وەك لـــە پـــەرەگراف پێـــشوو باسمـــان کـردووە بـە ئاسـتی نزمـەوە هـاتووە کەچـی سـاڵانە لـە نیـوەی تـەواوی مامۆسـتایان کـە دادەمـەزرێن دەرچـووانی کۆلیـژەکانی پـەروەردە نـین بەهـەموو بەشـەکان، بگـرە لـە دەرچـووانی کۆلیـژەکانی (زانـست ، ئـاداب ، کـارگێری و ئـابووری ، زانـستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتیەکان ، کشتوکاڵ)ن. وە ئەوانیش بە یـەك خـوولی شـیاندنی (١) مـانگی یـاخود مـانگ و نیـوی کـراون بـە مامۆستا بگرە زۆر جار خۆم شایەتحاڵ بووم کە دوای ساڵێك و دووان لـە مامۆسـتایەتی و وانـە ووتنـەوە بگـرە بەڕێوەبـەریش ئینجا پێیان ووتوە (کاکە تۆ هێشتا شارت گر نەداوە) بۆیـە ئـەم هاوینـە دەبێت بەشداری لە خـوولی شـیاندن بکـەیت وە هـەتاکو ئێـستاش هـیچ کەسـێك ئەگـەر خـۆی نەیویـستبێت یـاخود پاشەکشەی لـە خوولەکـە نـەکردبێت (فاشـل) یـاخود دەرنەچـوو

نەبووە لەم خوولە. خۆ ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەر خوێندنی بابەتە پەروەردەییەکان کۆلیجەکانی پەروەردە ئەوە دەبینین کە خوێندکار چەندە بەدەست ماددەکانی دەروونزانی گشتی و دەروونزانی منداڵ و هەرزەکار و بنەماکانی پەروەردە و ڕێگاکانی وانە ووتنەوە و هەڵسەنگاندن و پێوانە و ووردەکاری ماندوو و هیلاکە و بگرە زۆر جار کە دەرناچێت یاخود دەکەوێتە خوولی دووەمی لەبەر یەکێك لەو ماددانەیە.

هەڤاڵانی سەرکردەی پەروەردە ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە بابەتە زانستیەکانیش ئەوەی خوێندکارێکی بەشی کیمیای کۆلیجی زانست لە بابەتەکانی کیمیا دەیخوێنێ لە کۆلیجەکەی جیاوازی زۆری هەیە و سالأنەش لە (منهج) ئەم جیاوازیە لەگەڵ ئەوەی کۆلیجی پەروەردە جیایە، چونکە ئەویان بۆ مامۆستایەتی دەخوێنێ و ئەمیان بۆ کارکردن لە (کارگەیەك) (کۆگایەك) (شوێنێکی پیشەسازی) خوێندوویەتی. (من نالێم قەد وا ڕێك ناکەوێت دەرچوویەکی کۆلیجی زانست ، ئاداب ، کارگێری بە ئیمکانیەت تر بێت لە یەکێکی تری دەرچووی هەمان پسپۆری کۆلیجی پەروەردە) بەلأم وەك عەرەب دەلێت (لکل قاعدة شواذ) ئەوە ناکرێت بکرێتە بەرنامە و پرۆسە و پرۆگرامەکە لەسەر (شواذ) دابنرێت بۆیە پەیڕەو کردنی دامەزراندنی مامۆستا بە هەموو پێوەرێك هەڵەیە کە بەداخەوە پەیڕەوکردنی بەردەوامە.

نموونەیەك: (٢) ساڵ لەمەوبەر زانکۆی کۆیە بە نووکی قەڵەم کۆلیجێکی پەروەردەی زەبەلاح و ناووکی دەست پێکەری

درووست بوونی زانکۆی کۆیەی داخست. کە پرسیمان بۆ واتان کرد ئەوە چی بوو نیاز چی یە؟ هەندێك وەڵامیان داینەوە کەچی (مقنع) نەبوون وە بەداخەوەم هیچ کەس لە دەزگاکانی سەروو (حیزب) و (حکومەت) غەیری هەندێك پرتە و بۆڵە هیچی تریان نەووت وە نەکرد. کە لە سەرۆکایەتی زانکۆمان پرسی بۆچی واتان کرد؟ ئاخر مامۆستا زۆر پێویستە زوو بوو ئەم داخستن و دابەشکردنە (لە تەك ئەم داخستنە بەشی وەرزشیان کردە یەك کۆلیژی بەتەنهای سەربەخۆ چونکە پێویست تر بوو لە کۆلیژە پەروەردە گەورەکە! ؟). لە وەڵامدا ووتیان هەرکەسێك بیەوێت ببێتە مامۆستای پەروەردەکان ئەوە (٢) ساڵی تر با بخوێنێ لامان وە بڕوانامەی دبلۆمی باڵای (٢) ساڵەی دەدەینێ کە تەنها بۆئەوەی ببێتە مامۆستا ئەگەر هەڵەم نەکردبێت ڕاگرێکی بۆ دانرابوو بەڵام سەیر لەوەدابوو یەك کەسیش نەهات بۆ ئەم خوێندنە چونکە دەرچوویەکی کۆلیجەکانی زمان و زانستە کۆمەڵایەتیەکان دادەمەزرێت بە مامۆستاو دوای ساڵێك وەك پیاوان یەك خوولی شیاندنی (٤٥) ڕۆژی دەکات و (پرسی مەلاشی هەر ناوێت) ئینجا چ جای (٢) ساڵ خوێندن ئینجا ببێتە مامۆستا. بۆیە بەداخەوەم وە من بە پێ ی شارەزایی زیاتر لە (١٨) ساڵ لە بورای پەروەردە و خوێندنی باڵا و بەرپرسیاریەتی لەم دەزگایە ئەم بابەتە بە یەکێك لە هۆکارەکانی دابەزینی ئاستی خوێندن و خوێندکاران دەزانم وە داواکارم ئەم بابەتەم بە کراوەیی و بەچاوی قازانجی گشتی بهێڵرێتەوە بۆئەوەی هەڤاڵان و مامۆستایانی تری ئەم بوارە هۆکارەکانی

تریشی دەستنیشان بکەن و هەموومان بەیەکەوە هەوڵی باشتر کردن و بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندکاران و خوێندن بدەین.

تێبینی:

➢ ئەم بابەتە لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (٥٠٦٠) ی ڕۆژی (٢٠٠٩/١٢/٢٩) بڵاوکراوەتەوە.

## دابەزینی ئاستی پەروەردە و خوێندن، هۆکارو چارەسەر

### بەشی دووەم

دوای ئەوەی لەسەر ئەم بابەتە و ئەم تەوەرەیە لەژێر هەردوو ناونیشانەکانی (مامۆستا ، خوێندن، پەروەردە، پێشکەوتن) و (دابەزینی ئاستی پەروەردە و خوێندن (تاکە یەك هۆکاری)) دوو بابەتمان لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ بڵاوکردەوە وە واشمان بەباش زانی کە مامۆستا و پسپۆر و شارەزا و خەڵکی تریش لایەنەکانی تری ئەم بابەتە باس بکەن و خاڵی بێ هێزی تری دەست نیشان بکەن و ڕێگا چارەی بۆ دابنێن. بەڵام لەبەر گرنگی زۆری بابەتەکە و فراوانی پرۆسەی خوێندن و پەروەردە و وابەستەیی ئێمە بەم بابەتە و هەست کردنمان بە بەرپرسیاریەتی و ئەرك بۆ نووسین لەسەر ئەم بابەتە

خوا یاربێ هەوڵ دەدەین لەم جارەیان هۆکاری تر دەست نیشان بکەین وە لە ناوەڕۆکی بابەتەکان لەکاتی دەست نیشان کردنەکان ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت چارەسەر چی یە و چۆنە.

بەلای منەوە حکومەت و دەزگاکانی پەروەردە و سەرپەرشتیاری وەك باقی دام و دەزگاکانی تری دەوڵەت کە چۆن بە (عاتیفە) کاردەکەن ئەوە بۆ دەزگایەکی تری خانەنشینی ، چاودێری کۆمەلآیەتی،........هتد لەوانەیە خراپ نەبێت یاخود زەرەرەکە (محدود) بێت بەلآم بەداخەوە هاتووین لێرەش لە دەزگاکانی پەروەردە هەم لەگەڵ مامۆستا و بەرپرسانی پەروەردەیی و هەم لەگەڵ خوێندکاران بە (عاتیفە) هەڵس و کەوت دەکەین کە بەداخەوە زەرەری زۆری تیا دەکەین بۆ نموونە کە دەمانەوێت مامۆستایەکی پێویست بۆ گوندێك ، شارۆچکەیەکی تۆزێك دوور دابمەزرێنین کە خوێندکاری لێ یە و پێویستە مامۆستای لێ بێت کەچی کاتێك ئەو مامۆستایە گرفتەکانی خۆیمان بۆ باس بکات یاخود خزم و ناسیاومان بێت هەڵدەستین بە دانانی لە شوێنێکی نزیك کە خۆی دەیەوێت لەوانەشە پێویستی یەکە ئەوەندە زۆر نەبێت لەولاشەوە خوێندکاری بێ مامۆستا دەمێنێتەوە. یاخود سەرپەرشتیاری پسپۆری کە سەردانی مامۆستایان دەکات هەربەهەمان هۆکاری باسکراوی سەرەوە بە ووردی و بە جدی مامۆستا و ئاستەکەی و باش دەوام کردنی هەڵناسەنگێنێ بگرە لەبەر پەیوەندیەکان ڕەچاوکردنی هەندێك شتی (پەیوەندیەکان و عاتیفە)ەوە چاوپۆشی لێ دەکەن. دەپرسم، بە درێژایی (١٨) ساڵی

حوكمڕانی كوردی ئەگەر مەسائلی سیاسی و شەخسی لێ دەربكەین كێ و چەند مامۆستا و بەرپرسی پەروەردەیی لێ پێچینەوەیان لەگەڵ كراوە و سەرنجی ڕاكێشراوە؟ بۆئەوەی لەئاستی زانستی و ئیمكانیەتی مامۆستایان ڕازی بین پێویستە بەردەوام خوولی نوێبوونەوە و خۆ نوێ كردنەوە ( Refreshment) بۆ مامۆستایان ئەنجام بدرێت. وە وا پێویست دەكات لەبەر بەرژەوەندی گشتی هەرێم و خەڵكی كوردستان موجامەلەكان واز لێ بهێنیرێت وە ئەگەر خەڵكی بێ توانا هەبوو دوور بخرێتەوە لە مامۆستایەتی كە بەداخەوە (١٨) ساڵی حوكمڕانی تەواو ئەمە نەكراوە. ئەگەر ووردبینەوە و هەر لەسەر ئەم هۆكارە بڕۆین نموونەی زۆر و زەرەری زۆرمان بۆ دەردەكەوێت چونكە سەدان و هەزاران نموونەی دەرچووانی خوێندكاری تەمبەڵ و بێ ئاستی زانیستیمان لەبەرچاوە بەلاّم بە هۆكاری تری دۆستایەتی، خزمایەتی، عاتیفە و ......هتد مافی ڕاستەقینەی خۆی نادەینێ. ئەرێ گەلۆ ئەز دەپرسم مامۆستایەتی بەم شێوازە دەبێت و خوێندكاریەتی بەم جۆرە ڕەفتاری لەگەڵ بكرێت كاریگەری خراپی نابێت لەسەر تەواوی پرۆسەكە؟! چونكە زەرەر و خراپی یەكە تەنها بۆ ئەم چەندكەسە نی یە و نابێ بەڵكو مامۆستا و خوێندكار و كەسە چالاك و دڵسۆز و زیرەكەكانیش سارد دەكاتەوە. بۆیە كاریگەریەكەی دوو هێندە گەورەتر دەبێت.

قسەیەكی باوی سەر زاران هەیە و خۆم لە مامۆستایان و بەڕێوەبەرەكان و هەندێك سەرپەرشتیاران گوێم لێ بووە و

هەندێك جار هەڵوەستەتەم لەسەر كردووە كە دەڵێن خوێندكاری خوێندنی بنەڕەت (بەشی هەرەزۆری) ئەگەر خۆی خوێندكارەكە شتێكی تیا نەبێ و زیرەك نەبێت و بەدواداچوون نەكات ئەوە مامۆستایان باش وەك پێویست خۆیان لەگەڵیان ماندوو ناكەن و هیچ فێرنابن (بەشی زۆری مامۆستایان). ئێ باشە كێ بەرپرسیارە لەم بابەتە بەدواداچوونی بۆ بكات و چارەسەری بكات؟ من دەپرسم ئەوە هۆكاری سەرەكی و گەورەی دابەزینی ئاستی پەروەردە و فێركردن نەبێت ئەدی ناوی چی لێ بنێین؟!!

بە حوكمی ئەوەی خاوەن منداڵم سەردانی خوێندنگای منداڵەكانم دەكەم سەرەڕای ئەوەی بە درێژایی (١٩٩١ – ٢٠٠٤) مامۆستای كۆلیژی پەروەردە بووم سەردانی دوو سێ خوێندنگای ناوەندی و ئامادەییم كردووە ساڵانە وە چونكە خۆشم هەر حەزم بە بوونی پەیوەندی كردووە لەگەڵ خوێندنگاكان و مامۆستایان دوو تێبینی دەكەم كە بەداخەوە بەردەوامن بەشی هەرە زۆری باڵەخانەكانی خوێندنگاكان و هۆڵەكانی خوێندن و تاقیگەكان لەئاستی پێویست نین و ژینگەیەكی پەروەردەیی ئاستی نزمن پاك و خاوێن نین و وەك ئەوەی كە دەبێت. جگە لەوەش زۆربەی هەرە زۆری خوێندنگای وولاتەكەمان ژمارەی خوێندكاری ناو هۆڵەكانی خوێندن لە ڕادەی پێویست زیاترن و ئەو ژمارەیە ناگونجێت لەگەڵ سیستەمی نوێ ی پەروەردەی جیهانی. باشە من دەپرسم ئەرێ ئەم دوو هۆكارەش كاریگەری خراپیان نی یە لەسەر ئاستی پەروەردەیی و خوێندن؟! كێ بەرپرسیارە لەسەر ئەم بابەتە؟ پێم

وایە چارەسەری یەکەش ئەستەم نی یە و دەکرێت، زیادکردنی ژمارەی خوێندنگا بە پارە دەکرێت پاك و خاوێنیش بە بەرپرسەکانی پەروەردەیی دەکرێت و سزا و لێپێچینەوەیان بۆ بکرێت. وە بۆ بابەتی تاقیگەکان بەداخەوە وانەکانی (فیزیا ، کیمیا و بایۆلۆجی) کە سالأنی شەستەکان و حەفتاکان و تا کۆتایی هەشتاکان لە سەرتاسەری کوردستان گرنگی پێدانی باشتر بوو لە ئێستادا تەمبەڵیەك سەرجەم مامۆستایان و پسپۆرەکانی و سەرپەرشتیارانی گرتۆتەوە کە گرنگی یەکی ئەوتۆی پێ نادرێت. جێگای ئەستەمە ئەم لایەنە زانستی یە گرنگ و کاریگەرە فەرامۆش بکرێت. چونکە خوێندکاری بەشە زانستی یەکان بۆئەوەی نزیك و وابەستەی ئەم بابەتانە بن تەنها لایەنی تیۆری و هۆڵەکانی خوێندن هۆکاری بێزار کردن و تێنەگەیشتن دەبێت بۆیان، چونکە تاقیکردنەوەکان هەمان ئەو تاقیکردنەوانەن کە لەسەرتاسەری دوونیا ئەنجام دەدرێت. بۆیە دەپرسم ئەری ئەو کارە گرانە کە مامۆستا و خوێندنگاکان إجبار بکرێن بۆئەوەی هەڵسن بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکان و خوێندکاران ببەنە تاقیگەکان بۆ ئەوەی لەم خاڵە بێ هێزەش پەروەردە و خوێندن ڕزگاری بێت.

مامۆستایانم، پسپۆرانی بواری پەروەردە، داواکارم لێتان کە ڕۆژێك زووتر دەست پێ بکەین لەوەی کە دەکرێت بیکەین، چونکە ئەرکێکە و لە ئەستۆماندایە وە من لەم نووسینەم سێ چوار هۆکاری ترم دەست نیشان کرد هیوادارم ئێوەش هاوکاربن بۆ دۆزینەوەی هۆکاری تری بابەتەکەم. وە نیازمان هیچ

کەسێکی دیاریکراو نی یە وە لە قەدر و گەورەیی دەزگاکانی پەروەردە و هەڵسوڕاوانی ئەم دەزگایە کەم ناکەینەوە، بەڵکو نیازمان و ئاوات و ویستمان تۆکمەکردن و بەهێزکردنەوەی ئەم لایەنەی ژیانی خەڵکی کوردستانە کە ئایندەی هەموو لایەنەکانی تری ژیانی پێوە بەستراوە و خەمی هەمووماڵێك و تاکێکە. بۆیە بابەتەکەم هەر بەکراوەیی هێشتۆتەوە بۆ هەمووان بۆ نووسینی زیاتر و لێکۆڵینەوەی زیاتر....

تێبینی:

➢ ئەم بابەتە لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (٥٠٧٨)ی ڕۆژی (٢٠١٠/١/٢٠) بڵاوکراوەتەوە.

# دابەزینی ئاستی پەروەردە و خوێندن، هۆکارو چارەسەر

## بەشی سێ یەم

دوای ئەوەی لە سێ زنجیرەی یەك لەدوای یەك لەسەر بابەتی پەروەردە و پێشکەوتن و دابەزینی ئاستی زانستی و هۆکارەکانی و چارەسەری لە کوردستانی نوێ ئەم بابەتەمان هەڵسەنگاند و بە دید و بۆچوونی خۆمان هۆکارەکان و چارەسەرەکانمان نووسی و خستە بەر دیدی پسپۆران و بەرپرسان و خوێنەرانی خۆشەویستی کوردستانی نوێ. وا ئەمجارە لەم چەند پەرەگرافە بۆ کات وساتی ئێستا و لەم زەمەنە کۆتایی بەم بابەتە و بەم ناونیشانە دەهێنین، خوا یاربێت لە کاتێکی کورت و لەبەر گرنگی و زیندوویی بابەتەکە دەگەڕێینەوە سەری. بەڵام بەهیوای ئەوەی بەردەوامی بدەین بە باتەکە بۆئەوەی خوێندنی زانکۆیی و پەیمانگاکانیش بگرێتەوە.

خاڵێکی تری لاوازی بواری پەروەردە دەست پێکە. لە وولاتی ئێمە ئەم دەست پێکە لە پۆلی یەکەمی بنەڕەت دەست پێدەکات کە بەلای ئێمەوە (Pre stage) دەبێت هەبێت ئەویش

قۆناغی باخچەی ساوایانە کە بەداخەوە لە وولاّتی ئێمە گرنگی زۆر کەمی پێ دراوە من چەندین ساڵە گوێم لە ماموّستایان و هەندێك فەرمانبەری فەرمانگەکان دەبێت (پەروەردەکان و دەرەوەی پەروەردەکانیش) دەڵێن خۆم نەقلی پەروەردە دەکەم و بەڵکو لای ماڵی خۆمان ئاگام لە منداڵەکانی خۆشم دەبێت لە باخچەی ساوایان دەوام دەکەم. کە لە وەزعی ئەم ماموّستایانە وورد دەبیەوە هیچیان پەروەردەکاری باش نین و دەرچووی شوێنێك نین کە بۆ ئەم مەبەستە ڕاهێنرابن یان بڕوانامەیان وەرگرتبێت یاخود چەند خولێکی جدی تایبەتیان وەرگرتبێت و سەرکەوتوو دەرچووبن لەم خولانە، ئەمانە لەلایەك وە لەلایەکی تر لە شێوەی بینا و کارەبا و کورسی و کۆمبار و شتی دڵ خۆشکەر و گونجاو کەل و پەلی شیاوی منداڵی لەم تەمەنە نی یە بۆیە لەلایەك کەمی باخچەی ساوایان و گرنگی پێ نەدانی و لە لایەکی تر کەمی کارمەند و ماموّستای پسپۆر ئەگەر هەموویان بخەیتەوە سەریەکتر ئەم قۆناغە قۆناغێکی پشت گوێ خراوە کە بەداخەوە دەبێت لە هەموو ڕوویەکەوە چاکسازی و باشتر بکرێن. دەپرسم ئایا ئەم قۆناغە گرنگ نیە بۆ ئامادەکردنی منداڵ پێش چوونی بۆ قوتابخانە؟!

دوای ئەوە سیستەمی نوێ ی پەروەردە لە پۆلەکانی یەکەم و دووەم و سێ یەمی بنەڕەت دەرنەچوونی نەهێشتووە، بەلاّم لە گەلێك ماموّستا و سەرپەرشتیار و پەروەردەکارم پرسیوە کارێکی ناڕاستە و کاریگەری نەرێنی لەسەر ئاستی خوێندکار کردووە و ماموّستایانیشی ساردکردۆتەوە چونکە پرۆگرامی

نوێ ی پۆلی چوارەمی بنەڕەتی لە ئاستێکی وا دانراوە ئەگەر قۆناغەکانی پێشووتر هیچ فێرنەبووبن تووشی گرفتی دەرنەچوون و ئاست نزمی دەبن وە مامۆستایان ئەگەر لە پۆلی چوارەم مافی ڕەوای خوێندکار چۆنە ئاوا مامەڵەی لەگەڵ بکەن دەرناچێت وە ڕێژەیەکی زۆریش بە ناچاری ئاستەکە دادەبەزێنن و بەشێکی زۆریان دەردەچوێنن ( بە هۆکاری ڕێژەی دەرچوون).وە لە قۆناغەکانی داهاتووی خوێندکار ئەم ئاست نزمی و فێرنەبوونەی پێوە دیارە بە هەمان شێواز وانەکان قورستر دەبن ئەرکی خوێندکار و مامۆستا قورستر دەبێت بۆ دەربازکردن بە ئاستێکی نزمتر لەوەی کە دەبێت خوێندکار تێ دەپەڕێندرێت، (لە منالیەوە

فێرکراوین کە داری نەمام دەبێت لەسەرەتای ژیانی نەهێلدرێت خوار و چەماوە بێت کە گەورە و پیر بوو ڕاست نابێتەوە). من لە خاوەن بڕیارانی پەروەردەی کوردستان دەپرسم بۆ (Data) کۆ ناکەنەوە لە ئەهلی کارەکە بپرسن و ئەم بڕیارە بگۆڕن.

خاڵێکی گرنگی (هەرە جەوهەری) پرۆسەی خوێندن پڕۆگرامەکان و سەرچاوەکانی خوێندنە ئەوەی ساڵانێکە لە کوردستان پەیڕەو دەکرێت خێرا خێرا گۆڕینی پەرتووکەکان و شێوازی نووسین و بەرگ و ناوەڕۆکی و ........هتد کە زۆربەی هەرە زۆری بە پارەیەکی زۆر و لە دەرەوەی کوردستان چاپ دەکرێت بەڵام لە ڕووپەڕی ڕۆژنامەکان دەیان و و زیاتریش مەقالە و ڕاپۆرت و ڕەخنەمان لەسەر ئەم بابەتە خوێندۆتەوە و

پرسیاری زۆرمان لە مامۆستا و سەرپەرشتیار و پەروەردەکاران کردووە وە گەیشتووەمەتە ئەو قەناعەتەی کە ئەم کارە ڕەخنە و گلەیی هەڵدەگرێت و کەم و کوڕی زۆری تیایە و گرفت و لەمپەری دروست کردووە لە بەردەم پرۆسەی خوێندن و ئاستەکەی. بە پێ ی زانیاریەکان بەشێك لە پەرتووکەکان لەسەر بنەما و هاوشێوەی خوێندن لە وولاتێکی پێش کەوتوو دانراوە وە هەندێك کاری وەرگێڕانەکە ئەوەندە بە خراپی کراوە کە چەندین ووشە و زاراوەی داتاشراو بەکاردێت لەلایەك تێگەیشتنی قورسە لەلایەك ڕستە و پەرەگرافی وای لێ درووست بووە لە ئەصلی بابەتەکە دوور دەکەوێتەوە. سەرەڕای ئەوەی خوێندکار دەبێت پلە بە پلە و پایەپایە سەرکەوێت، ناکرێت ئەو لە ئاستێکی مەعریفی و زانستی سنوردار یەکسەر چەند پایەیەك بەرزبکرێتەوە بۆ سەروتر وە ئەگەر واشمان کرد دەبێت سەرەتا لە یەکەمی بنەڕەتەوە قۆناغ بە قۆناغ سەرکەوین نەوەك چەندین قۆناغ بەیەکەوە، هاوشان لەگەڵ ئەوەش دەبێت خوولی ڕاهێنان بۆ مامۆستایانیش بکرێتەوە چونکە وەك لە بابەتەکانی پێشووتری ئەم زنجیرە بابەتە باسمان کرد ئاستی مامۆستایانیش وەك پێویست نی یەو دەیان گرفت و خاڵی لاوازیان هەیە. (( کە خوێندکارێکی چوارەمی بنەڕەت گریا بە دەست قورسی و هەڵگرتنی جانتاکەی کە سەرجەم پەرتووکەکان و پەڕاوەکان ڕۆژانە هەڵدەگرێت مانای هیچ ناگەیەنی؟!. ئەی نابێت ڕەچاوی ئەم خاڵە بکرێت کە ئەمە دژی بنەمای سیستەمی نوێ یە کە خوێندن بۆ هەمووان و ئاسانکاری تیایدا لەڕووی

دەرونی یەوە ئەم منداڵە هەموو پرۆسەی خوێندن بە بارگرانی و قورس نازانی[۲]؟!)).

لەم شارەی من لە یەکێك لە قوتابخانەکان ماموستایەکی زانست لە بەردەم خوێندکارەکانی پۆلیکی بنەڕەتی دەستە و دوعا وەستاوە ووتویەتی خوا ئەو کەسانە بگرێت کە ئەم پەرتووکە و ئەم بابەتانەیان بەم شێوەیە تووشی ئێمە کردووە. ئەمەی لە حاڵەتێك ووتوە کە نە لە ماددەکە گەشتووە نە توانویەتی خوێندکارەکان تێ بگەیەنێ. ئەرێ بەڕێزانی سەرپەرشتیارانی پەروەردە ئێوە بێ ئاگان لەم بابەتە؟ ئەرێ بە سەرووی خۆتان نەوتووە کە ئەمە چەند کاریگەری خراپی لەسەر خوێندکارەکان دەبێت کە لەناو هۆڵ ماموستاکەیان لەم وەزعەبێت دەبێ حاڵی ئەوان چۆن بێت؟ تا کەی دەبێت یەك دوو کەسێك یان چەند کەسێك خۆیان بکەن بە کوێخای هەموو پرۆسەی پەروەردە و گۆڕانکای و ڕێنمایی دابەزێنن و ئەو لەشکرە زۆرەی ماموستایان نوقەیان لێوە نێت و ڕەئی نەدەن و خاڵی لاوازی دیاری نەکەن و بەشدار نەبن لە گۆڕانکاریەکانی و دواتریش گلەیی و خەتاکە بکەوێتە ئۆباڵی ئەوان. ئەرێ دەپرسم و دەڵێم ئەو هەموو کەم و کوڕی و ناڕاستی یە هەبێت و بێ دەنگی لێ بکرێت پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن قوڕبەسەر و زەلیل نەبێت ئەدی چی دەبێت؟! بۆیە دەبێت ئەم وەزعە چاك بکرێت و ئەم دیدە بگۆڕدرێت.

لە کۆتایی بابەتەکە هەرچەندە دەزانم نەمتوانیوە هەموو لایەنەکان باس بکەم و بیپێکم بەڵام هەوڵم داوە وە بۆ پێویستی

من و بابەتەکە هەوڵم داوە خەڵکی تر و بەتوانا بێنمە گۆ بەهیوای ئەوەی خزمەتێك بکەین.

ئەم هەموو هۆکارە و کەم و کوڕیە نابێت مامۆستایان سارد بکاتەوە وە نابێت بەرپرسە باڵاکان لە ڕەخنەگرتن نیگەران و دڵ شکاو بکات هەموومان هەڵە دەکەین بەڵام شتێك هەیە پێ ی دەڵێن (Logic) واتە ڕاستی و دروستی ئەگەر هەر کەسێك کاری ڕاست و درووست بکات یان ڕێگای بۆ دەست نیشان بکات نابێت لێ ی لە هەڵلا بدرێت تاوانبار بکرێت بەوەی دژی فلان و فیسارە بەڵکو بۆ هەموومانە ئەم بابەتە خێر و بێری بۆ تەواوی خەڵکی کوردستانە.

تێبینی:

➢ ئەم بابەتە لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (٥٠٩٥)ی ڕۆژی( ٢٠١٠/٢/٩) بلاوکراوەتەوە.




پرۆفیسۆری یاریدەدەر

**د . ولی محمود حمد**


- لەساڵی ۱۹٦۳ هاتۆتە دنیاوە
- لەساڵی ۱۹۸۷ بڕوانامەی بکالویوسی لەبواری کیمیا بەدەست هێناوە.
- لەساڵی ۱۹۹۰ بڕوانامەی ماستەر لە کیمیای فیزیاوی بەدەست هێناوە.
- لە ساڵی ۲۰۰۱ بڕوانامەی دکتۆرا لە کیمیای فیزیاوی (بەللوری شل) بەدەست هێناوە.
- لەساڵی ۲۰۰٥ پلەی زانستی پرۆفیسۆری یاریدەدەری بەدەست هێناوە.
- لەساڵی ۲۰۰٤ەوە تا ئێستا ڕاگری پەیمانگای تەکنیکی کۆیەیە.
- خێزاندارەو خاوەنی ۳ منداڵە بە ناوەکانی: (زانیار ، پەروا ، شارا )


- پۆستی ئیلیکترۆنی walihmd@yahoo.com
- ژ. تەلەفۆن ۰۷۷۰۱٤٦۷۳۹۲ ، ۰۷٥۰۱۱۹۱۳٦۳



لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەو پەخشی کۆیە

چاپی یەکەم